# شەرحی متنی اجرومی

## بەکوردی

وەرگێرانی لە عەرەبی یەوە

**سامان نجیم محمد صالح**

پێداچونەوەی

(ماموستاملا أحمد قاصیشی)

پێداچوونەوەی ڕێزمانی

ماموستا / بختیار مصطفی بیارەیی

١٤٢٠ی کۆچی . ٢٧٠٠ی کوردی . ٢٠٠٠ ی زایینی

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمدلله الذي جعل العربية مفتاح البيان ، وصيّرها آلة يحترز عن الخطأ في اللسان ، وقوم بسببها المنطق الذي هو المميز للانسان ، وهيأها سلما يرتقي بها الى ذروة حقائق للقرئان ، والصلاة والسلام على خير الأنام (محمد الفرقان) ، وعلى آله واصحابه رؤساء أهل الايمان .

سوپاس و ستايشى بێپايان بۆ پەروەردگارى هەردووجيهان ، درودوسەلام لەسەرگيانى پاكى پێغەمبەرايەتى حەزرەتى ( محمد المصطفى) (ﷺ) وەلەسەر گشت يارو ياوەران وشوێنكەوتوانى بەكۆمەڵ ، سوپاس بۆخوايێكى وا كەئەم هەموو نيعمەت و سيفەتەى بەئێمە بەخشيوە كە عەقڵ سەركردەى گشت ئەندامەكانە بەهۆى ئەو عەقڵەوە چاك و خراپ و ئاينى پاكى شەريعەتى ئيسلام ئەزانرێ ، شەرح كردنى ئەم پەرتووكە يەكێكە لەو سيفەتانەى كەخواى باڵابەدەست پێمانى بەخشيوە ،

ئەم پەرتووكە زياتر پەيوەندى بەحوجرەو فەقێ و مزگەوتەكانەوە هەيە بۆيە وشەكانى هەروەكو خۆى دانراوەتەوە نەكراون بە كوردى وەكو وشەى ((فاعل ، مفعول ، مبتدا ، خبر ، فعل..الخ )) زياتر فەقێ و خوێنەرانى ئەم پەرتووكە لەو وشانە باشتر تێدەگەن تاوەكو لەباتى (( فاعل )) بكەر بنووسرێ يان ((فعل )) فرمان بنووسرێ بەڵام بۆ زياتر زانيارى لەبارەيانەوە هەموويان لەيەك پەڕەدا لە قەواعيدى عەرەبىيەوە ئەكرێن بەڕێزمانى كوردى ، وەداواى لێبوردن لەبرايان وخوشكانى بەڕێز دەكەين لەهەركەم و كورتىيەك كەهەبێت لەكارەكەماندا ، چوونكە هەموو دەزانين كامڵ و تەواويەت هەربۆ خواى مەزنە .

زۆر سوپاس وپێزانينى خۆم ئاراستەى بەڕێز(( مامۆستاملا أحمدى قاميشى )) دەكەم بۆ پێداچوونەوەى ئەم پەرتووكە وەهەروەها سوپاس و پێزانينى خۆم ئاڕاستەى بەڕێز (( مامۆستا بختيارمصطفى )) بيارەيى كە ئەدەبياتى ڕێزمانى ئەم پەرتووكەى گرتوەتە ئەستۆى خۆى ، وەئەم پەرتووكە (انشاالله ) ئەبێتە ئەجرو پاداشت لەڕۆژى قيامەتا بۆ مان .

سامان نجيم محمد صالح

پێش نوێژىمزگەوتى

((تەكيەيى هەڵەبجەى شەهيد))

٥ى رجب / ١٤١٩ ى كۆچى ـ ٢٢ى ڕەزبەرى/ ٢٦٩٩ى كوردى

١٤ / ١٩٩٩/١٠ى زاينى

# خشتەی یەکەم (١)




١) جاءَنى زيدٌ
٢) رأيت زيداً
٣) مررت بزيدٍ

٤) جاءَنى أبوكَ ٥) رأيتُ أباكَ
٦) مررتُ بابيكَ ٧) الطلابُ يكتبونَ

٨) لم يضربْ
٩) لم يرمِ
١٠) لم ينصروا + لن ينصروا

# خشتەی دووەم (٢)




١) جاءنی زیدٌ ، رأیت زیداً ، مررت بزیدٍ. ٢)جاءنی رجالٌ ، رأیت رجالاً ، مررت برجالٍ ٣) جاءنی احمدُ ، رأیت احمد ، مررت باحمدَ .
٤) جاءتنی مسلماتٌ ، رأیت مسلماتٍ ، مررت بمسلماتٍ. ٥) لەهەمندێ پەرتووك دا بەنەسمای ستە هاتووە کە وشەی (هنو) هاتوە بەوتای عەورەت ، جاءنی ابوە ، رأیت اباه ، مررت بأبیه. ٦) جاءنی مسلمون ، رأیت مسلمین ، مررت بمسلمین . ٧) جاءنی زیدانِ ، رأیت زیدینِ ، ومررت بزیدینِ.
جاءنی کلاهما ، رأیت کلیهما ،ومررت بکلیهما. ٨) لم یضربْ : حزفی حەرەکەی ئاخری کراوە . ٩) لم یرمِ :حزفیحرفی ئاخری کراوە کە(یا) بووە

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله رب العالمين ،الصلاة والسلام على سيدنا محمد وعلى آله واصحابه أجمعين .

متن ألآجرومية لمحمد بن محمد بن داود الصنهاجي {٦٧٢ ـ ٧٢٣ هـ}ألكلامُ هوَ ألّلفظ ألمركبُ ألمفيدُ بالوضعِ ، وَأقسامُهُ ثلاثةٌ : اِسمٌ ، وفعلٌ ، وحرفٌ جَاءَ لِمعنىً ؛ فالأِسمُ يُعرَفُ بِالخفضِ وَالّتنوينِ ودخولِ الآلِفِ وألّلام ؛ ...........................................(٢)

**بەناوی خوای بەخشندەو مهرەبان**

**سوپاس و ستایشی بیٌپایان بۆ پەروەردگاری هەردوو جیهان ، وە ڕەحمەت و ئەمین بوونەوە لەسەر گیانی پێغەمبەر ( ﷺ) وەیارو یاوەرانی بەکۆمەڵ .**

**ئەم پەرتووکە کەبریتی یە لە ((متنی آجرومی ))یە کەدانراوی محمدی کوڕی محمدی کوڕی داود کەخەڵکی (صنهاجی)یە ، لەساڵەکانی { ٦٧٢ـ ٧٢٣} هیجری دا ژیاوە خوای مهرەبان بەرەکەت زیاتر برژێنێ بەسەر مەرقەدیا.**

**« الكلامُ هو ألّلفظ المركبُ الموفيدُ بالوضعِ » (١) وشەی ((کەلام )) واتە قسە :ـ کە چەند وشەیەکە کەواتا بدات بەدەستەوە (لفظ) بێت (( واتە بەزوبان بوترێ)) کەپێك هاتبێت لە دوو وشە یان زیاتر ئەمجا ئەتوانرێ کەلام و ڕستە دروست بکرێت وەتێگەیشتنی هەبێت بەدانان ، ئەو ڕستەیەی درووستی دەکەیت پێویستە واتایەکی تەواو بدات بەدەستەوە و کۆتایی هەبێت ،چونکە وشەمان هەیە نە نوسرێ بەلأم واتای نی یە کەواتە دەردەچن لەڕستە وەکو وشەی ((دیز بیز))کەئەمانە واتایان نی یە.**

**بەکورتی کەلام ڕستەیەکە کەپێك هاتبێت لەچەند وشەیەك و دابنرێ بۆ واتایەکی تەواو.**

**« وأقسامُهُ ثلاثةٌ : اسمٌ ، وفعلٌ ، وحرفٌ جاءَ لِمعنىً» بەشەکانی ڕستە سێ بەشە یەکەم: ناوە ، دووەم: ((فعل))ێك کەواتایەك بگەیەنێ ، سێیەم : حەرفە ((پیت )) . کەواتە ڕستە لەم سێ بەشە دروست دەبێ. اسم بۆدروست بوونی ڕستە و کەلام پێویستی بە (فعل و حرف) نی یە ، خۆی ڕستە دروست دەکات وەکو ((زيدٌ قائمٌ )) (٢) واتە زەید هەڵساوە ، بەلأم فیعل و حەرف بەبێ ئیسم ناتوانن ڕستە دروست بکەن . «فالأِسمُ يُعرَفُ بِالخفضِ وَالّتنوينِ ودخولِ الآلِفِ وألّلامِ» ئەوەی کەناو بێت ئەناسرێ بەم نیشانانەی کەهاتوون ، جەڕەی هەبێ وەکو زيدٍ ، بكرٍ ، عمرٍو ، وەهەروەها (( ناو )) تەنوین دار دەبێ دووسەر ((زيداً )) دوو ژێر (( زيدٍ )) دوو بۆر ((زيدٌ )) وە(( ناو)) ئەلف و لامی دەچێتە سەر کە ناو دەبرێ بە (ئەلف و لامی تەعریف) واتە ناسراو وەکو ((الرّجل )) کەواتە جەڕ و تەنووین و ئەلف و لام لەتایبەتمەندیەکانی ناوە کەهیچ کام لە مانە ناچنە سەر فعل و حەرف . خاصە وتایبەتی ناون.**

(١) کلام: قسەیە واتە ئەوەی قسە ئەبێ دەرەچێ وەکو ئیشارەت کردن و سەرە لەقەو دلکوتین . مرکب : ئەوەیە کە پێك هاتبێ لەچەند وشەیەك واتا بدەر بەدەستەوە لەڕستەدا ، المفید : واتە سوود و کەڵکی هەبێ. بالوضع : ئەوەیە کەوا بنوسرێ ا (٢) زيد : مبتدا مرفوع . قائم : خبر مرفوع .

**وحُروفِ الخفضِ وهيَ : مِن ، والِىٰ ، وعن ، وعلى ، وفي ، ورُبَّ ، والكاف ، واللام ؛ والحروف القسم وهيَ: الواو ،والباء ، والتاء ؛ والفعلُ يُعرفُ بقدْ والسِّينِ و سوفَ ، وتاءِ التأنيثِ السّاكنةِ ؛ ..........................................................(٣)**

---

﴿وحروفِ الخفضِ وهيَ ﴾ حرفەكانی خفض واتە حەرفە جەڕرەكان ئەمانەن﴿من ، والى ، وعن ، وعلى ، وفي ، وربَّ ، والكاف ، واللام؛ والحروف القسم وهيَ: الواو ،والباء ، والتاء ﴾ ئەمان نموونەیان لەڕستەدا ئەڵێین :

١ـ من : بۆ دەست پێكردن دێت ((سرتُ من البصرةِ الى الكوفة ))(١) واتە لەبەسرەوە ڕۆیشتم بۆكوفە.

٢ـ الى : بۆ كۆتایی هاتن بەكاردێت ((سرتُ من البصرةِ الى الكوفةِ ))،واتە لەبەسرەوە ڕۆیشتم بۆ ئاخری كوفە .

٣ـ عن : بۆ دەرچوون لەناو شتێ دا دێت (( رميتُ السهمَ عن القوسِ )) (٢) ، واتە وەشاندم تیرەكە لەناو كەوانەكەدا . ئەم سیانەی سەرەوە هەرچەندە حرف و پیتن واتای تەواو نابەخشن بەتەنها بەڵام هەرسێكیان لەزمانی كوردی دا واتای (لە) دەبەخشن .

٤ـ على : بۆ شتێ بەكار دێت كەبەرز بێو لەسەر بێ (( زيدٌ على السطحِ ))(٣) واتە زید لەسەر بانەكەیە.

٥ـ في : بۆ شتێكە كەلەناوی دا بێت (( صليتُ في المسجدِ )) (٤) واتە نوێژم كرد لەناومزگەوتدا .

٦ـ رُبّ : بۆشتی كەم بەكار دێت (( رُبَ رجلٍ جوادٍ لقيتهُ ))(٥) واتە هاوڕێی كەم پیاوی سەخیم كردوە.

٧ـ كاف : بۆلێك چوون دێت ((تشبيه )) ((زيدٌ كالأسدِ)) (٦) واتە زید وەكو شێر وایە .

٨ـ لام : بۆ خاوەنداریەتی و موڵكایەتی دێت (( المالُ لزيدٍ )) (٧) واتە ئەو ماڵە موڵكی زیدە .

(واو ، باء ، تاء ) : هەرسێكیان بۆ سوێن خواردن دێن (( والله وبالله وتالله لأفعلنَ كذا ))(٨) واتە سوێندبێ بەخوا ئەوكارە دەكەم.

﴿والفعلُ يُعرفُ بقدْ وسّينِ و سوفَ ، وتاءِ التأنيثِ الساكنةِ ﴾ ئەم چوار حەرفە ئەچنە سەر ((فعل)) كەنیشانەو تایبەتمەندی ئەون و فعلیان پێ ئەناسرێتەوە .

---

(١) سرت ، فعل و فاعل ، من البصره ، جارو مجرور، الى الكوفة :جارو مجرور .

(٢) رميت ، فعل و فاعل ، السهم ، مفعول به ، عن القوس ،جارو مجرور .

(٣) زيدٌ ، مبتدا ، على السطح ، جارو مجرور لمحلا خەبەرە بۆ زەید .

(٤)صليت ، فعل و فاعل ، في المسجد ، جارو مجرور .

(٥) ربّ ،حرف جر ، رجلٍ ،إسم مجرور مضاف ، جوادٍ :مضاف اليه ، لقيتهُ : فعل و فاعل و مفعول به .

(٦) زيدٌ ، مبتدا ، كالأسد ، جارومجرور لمحلا خەبەرە بۆ زەید .

(٧) المال ، مبتدا ، لزيدٍ ، جارو مجرور لمحلا خەبەرە بۆ مال.

(٨) والله وبالله وتالله ، جارو مجرورن ، لام ، وەڵامی سوێندەكەیە ، افعلن ، فعلی مضارعە فاعلەكەی تیا شاراوەتەوە بە ((انا)) ، كذا ، مفعول به .

والحرفُ مالا يَصلُحُ معهُ دليلُ الإسم ولادليلُ الفعلِ { باب الأعرابِ} الإعرابُ :هوتغييرُ أواخرِ الكلمِ ، لإختلافِ العواملِ الداخلةِ عَليها لفظاً أو تقَديراً ، وَاقسامُهُ اربعةٌ : رفعٌ ونصبٌ وخفضٌ وجزمٌ ، فللأسماءِ من ذالكَ الرّفعُ والنّصبُ والخفضُ ولا جزمَ فيها ؛ وللافعالِ من ذالك : الرفعُ والنصبُ والجزمُ ولا خفضَ فيها ..............(٤)

---

* قد : ئەچێتە سەر فعلی ماضي بۆ (( تحقيق))دێت وەکو (( قد قام )) واتە بەڕاستی هەستاوە ، بەڵام بۆ سەر فعلی مضارع بۆ کەمی دێت وەکو ((قد يقوم )) واتە کەمجار هەڵدەستێ .

* سين وسوف : تايبەتن بە((مضارع))ەوە بۆ بەردەوامی و داهاتوو بەکار دێت وەك ((سيتقدم و سوف اتوب )).

* تاء التأنيث الساكنة : ئەم حەرفە دەچێتە سەر وشەی ((مؤنث )) وەکو ((ضربت )) .

﴿والحرفُ مالا يصلُحُ معهُ دليلُ الإسم ولادليلُ الفعلِ﴾ حرف ناگونجێ لەگەڵ فعل دا ببێ بەدەليل بۆ إسم ، يان ڕستە درووست بکەن، وەبۆ حەرفيش نابێ چوونکە حەرف زۆر کزە .

## {باب الأعراب}

ئەم (باب) ە ، باس لە إعراب دەکات بۆ جياکردنەوەی فاعل لەفعل يان بەپێچەوانەوە يان بەشێوەيەکی گشتی بەهۆی ئەو (إعراب)ەوە هەمووی لەجێگای خۆيدا بناسرێ .

﴿ الإعرابُ :هوتغييرُ أواخرِ الكلمِ ، لإختلافِ العواملِ الداخلةِ عليها لفظاً أو تقديراً﴾

وشەی(إعراب) : . واتە گۆڕانی ئاخری وشەيەك لەبەر ئاڵوگۆڕکردنی ئەو عاملانەيە کەئەچنە سەر (إعراب)ەکە وەکو لە وتەدا بێت وەکو (زيد) وەيا تقدير بێت وەکو (سَعدى) ، وشەی زيد هەر سێ حاڵەتی إعراب دەچێتە سەری ( زيدٌ ، زيداً، زيدٍ) بەڵام لەوشەی(سَعدى) بەتقدير ئەڵێين مجرورە يان مرفوعە چوونکە حاڵەتی (جەڕەو ڕەفعەی) بەنەصبەيە؛ ﴿واقسامُهُ اربعةٌ : رفعٌ ونصبٌ وخفضٌ وجزمٌ﴾ وەبەشەکانی إعراب چوارن يان مەرفوعە ، يان مەنصوبە ، يان مەجرورە ، يان مەجزومە ؛﴿فللأسماءِ من ذالكَ الرّفعُ والنّصبُ والخفضُ ولا جزمَ فيها﴾ بەشەکانی (إعراب ) چوار بەش بوو ، دابەش دەکرێ بەسەر(إسم ، فعل ، حرف)لەبۆ إسم سێ دانە هەيە لەچوار بەشەکەی إعراب (ڕەفع و نەصب و جەڕ) واتە بۆر و سەر و ژێر بەڵام (جەزمە) نىيە لە إسم دا .

﴿وللافعالِ من ذالك : الرفعُ والنصبُ والجزمُ ولا خفضَ فيها.﴾ وەلە بۆ (فعل) سێ حاڵەت هەيە ( ڕەفع ونەصب وجەزم) بەڵام جەڕەی نىيە ؛ فەرق وجياوازی نێوان ( إسم و فعل) ئەوەيەکەإسم جەڕەی هەيە و جەزمەی نىيە بەڵام فعل بەپێچەوانەوەيە ، کەواتە فعل مەجرور نابێ ، وە إسم مەجزوم نابێ .

{بابُ مَعْرِفَةُ علاماتِ الإعراب } للرّفع أربعُ علاماتٍ الضّمةُ والواو والألفُ والنونُ ؛ فامّا الضّمةُ فتكونُ علامةً للرفعِ في أربعة مواضعَ : في إسم المُفرَدِ ، وجمع التّكسير ، وجمع المؤنث السالم والفعل المضارع الذي لم يتصلْ بآخرهِ شيءٌ وأمّا الواو فتكونُ علامةً للرفعِ في موضعين: في جمع المذكرالسالم ، وفي الاسماءِ الخمسةِ وهي : أبوكَ وأخوكَ وحموكَ و فُوكَ وذومالٍ ؛ وأما الألِفُ فتكونُ علامة للرفع في تثنيةِ الأسماء خاصةً ........................(٥)

---

﴿بابُ مَعْرِفَةُ علاماتِ الإعراب ﴾ ئەم ( باب)ە باس لەناسینی نیشانەکانی إعراب دەکات هەریەکە یان لەجێگای خۆیدا . ﴿للرّفع أربعُ علاماتٍ﴾ بۆحاڵەتی (رفع )ە واتە ئەوەی کەوا مەرفووع بێ ، چوار نیشانە هەیە کە بناسرێتەوە ﴿الضّمةُ والواو والألفُ والنونُ ﴾ ئەم چوارە لەحاڵەتیمەرفوع دان.﴿ فامّا الضّمةُ فتكونُ علامةً للرفعِ في أربعة مواضعَ﴾ (ضمة) واتەبۆرنەبێ بەنیشانەبۆحاڵەتی رەفعەلەچوارجێگا دا:﴿في إسم المُفرَدِ ﴾ یەکەم لەناوێکی تاك دا وەکو ((زيدٌ قائمٌ )) یان((جاءنی زیدٌ)).﴿وجمع التّكسير﴾ دووەم رەفعە ئەبێ بەنیشانە لە((وجمع التكسير))دا وەکو ((جاءني الرّجالُ )) کۆمەڵێ پیاو هات بۆلام . ﴿وجمع المؤنث السالم ﴾ سێیەم رەفعە کەدەبێتە نیشانە لەکۆمەڵێ مؤنث وەکو ((جاءني المسلماتُ )).

﴿ والفعل المضارع الذي لم يتصلْ بآخرهِ شيءٌ﴾ چوارەم رەفعە ئەبێ بەنیشانە لەفعلی (مضارع)ێك دا کەئە لکابێت بەکۆتایی وشەکەوە هیچ شتێك وەکو( يضربُ)، ئەم چوار بەشەی کەباس کران لەحاڵەتی رەفعە دان و مرفوعن بە (ضمة) .

﴿وأمّا الواو فتكونُ علامةً للرفعِ في موضعين﴾ نیشانەی إعراب چوارە یەکەم (ضمة)بوو باسکرا دووەم (واو)ە ئەبێت بەنیشانە بۆ حاڵەتی ڕەفعە لەدوو جێگادا ﴿في جمع المذكرالسالم﴾ یەکەم بۆ کۆمەڵی پیاو وەکو(جاءنی مسلمون )(١) کۆمەڵێ پیاوی باوەڕدار هاتن بۆلام (واو)حاڵەتی ڕەفعەی(جەمعی موزەکەر)ە ﴿وفي الاسماءِ الخمسةِ ﴾ دووەم لە اسمای خمسەدا وەکو (جاءنی ابوك)(٢) باوکی تۆ هات بۆلام. واوی (ابوك) لەحاڵەتی ڕەفعە دایە . ﴿وهي﴾ اسماء خمسە کە پێنج ناون ئەمانەن ﴿أبوكَ﴾ باوکی تۆ ﴿وأخوكَ﴾ وەبرای تۆ ﴿وحموكَ﴾ خزمی ژنەکەی تۆ ﴿و فوكَ﴾ دەمی تۆ ﴿وذومالٍ﴾ خاوەنی ماڵ . ئەم پێنج ناوە ناسراوون بە اسماء خمسە کەحاڵەتی ڕەفعەیان بە واوە .﴿وأما الألِفُ فتكونُ علامة للرفع ﴾ ئەلف سێهەم بەشە لەبەشەکانی إعراب ئەبێ بە نیشانە بۆ حاڵەتی رفع ﴿للرفع في تثنيةِ الأسماء خاصةً﴾لە تثنيةِ کردنی ناوەکان بەتایبەت ،

---

(١)جاءنی : فعل ماضی ، نون : وقایە، ی : مفعول بە پێش کەوتوە، مسلمون، فاعل مرفوعە حاڵەتی ڕەفعەکەی بەواوە، چونکە جەمعی موزەکەرە .

(٢)جاءنی : فعل ماضی ، نون : وقایە ، ی : مفعول بە ، ابوك : فاعیل حاڵەتی ڕەفعەی واوە ، کاف : (مضاف الە) ی یە .

وأما النونُ فتكونُ علامةً للرفع في الفعلِ المضارع الذي اذا أتصلَ به ضميرُ تثنية أو ضميرُ جمع او ضميرُ المؤنثةِ المخاطبةِ { وللنصب خمسُ علاماتٍ } الفتحةُ والألفُ و الكسرةُ والياءُ وحذفُ النونِ . فأما الفتحةُ فتكونُ علامةً للنصب في ثلاثةِ مواضع : في الإسم المفردِ ، وجمع التكثير ، والفعلِ المضارع إذا دخل عليه ناصبٌ ولم يتصل بأخره شيءٌ وأما الألفُ فتكونُ علامةً للنصبِ في الأسماء الخمسةِ نحو: رأيتُ أباك وأخاك ...........................(٦)

---

واته ((ئەلف)) ئەبێت بەحاڵەتی ڕەفعە لە (تثنية) ی ناودا وەکو ((جاءنی زیدان ))(١) دوو زەید هاتن بۆلام ، ئەلفی زەید لەحاڵەتی ڕەفعەدایە و فاعلە ، «وأما النونُ فتكونُ علامةً للرفع في الفعلِ المضارع الذي اذا أتصلَ به ضميرُ تثنية» نون کەچوارەم بەشە لەبەشەکانی إعراب کەئەبێ بەنیشانە بۆحاڵەتی ڕەفعە لەفعلی ((مضارع))ێکدا کەبلکێ پێوە ضمیری (تثنية) وەکو ((یضربان))«أو ضميرُ جمع» یان ((مضارع))ێکە ضمیری جەمعی هەبێ وەکو ((یضربون))کەواتە ضمیری جمعکە~~لەوانە لکاوتیە~~ فعلی موضاریعەوە «او ضميرُ المؤنثةِ المخاطبةِ» وە فعلی موضاریعێکە کە ضمیری (مؤنثی مخاطب) هەبێ پێوە وەکو ((تضربین)) نون ئەبێ بەنیشانەی رفع . کەواتە لەو سێ حاڵەتەی سەرەوەدا (نون) بووە بە نیشانەی رفع.

(مصنف) ڕەحمەتی خوای لەسەربێت باسی ڕەفعەی تەواو کرد هاتە سەرباسی منصوبات و ئەڵێت. «وللنصب خمسُ علاماتٍ» بۆ حاڵەتی نصب پێنج نیشانە هەیە «الفتحةُ والألفُ و الكسرةُ والياءُ وحذفُ النونِ»ئەم پێنج حاڵەتە ئەبن بەنیشانە بۆ منصوبات.« فأما الفتحةُ فتكونُ علامةً للنصب في ثلاثةِ مواضع» وتمان بۆ (منصوبات) پێنج نیشانە هەیە یەکەم:( فەتحە) یە واتە (سەر) ئەبێت بەنیشانە بۆ حاڵەتی ( نصب) لەسێ جێگادا.«في الإسم المفرد » یەکەم: لەناوێکی تاك دا وەکو ((ضربت زیدا )) دام لە زەید « وجمع التكثير» دووەم: فتحە ئەبێت بە نیشانە بۆحاڵەتی نصبە (لەجەمعی تکسیر) دا ، وەکو (( رایت رجالا)) واتە کۆمەڵێ پیاوم بینی « والفعلِ المضارع إذا دخل عليه ناصبٌ ولم يتصل بأخره شيءٌ» سێیەم (فتحە) ئەبێت بەنیشانە بۆحاڵەتی نصبە لە فعلی موضارع ێکدا کە بچێتە سەری یەکێك لەناداتی (ناصبە) ومەنەلکابێت بەکۆتایی وشەکەوە هیچ شتێك وەکو (( لن یضرب )) . «وأما الألفُ فتكونُ علامةً للنصبِ في الأسماء الخمسةِ » دووەم بەش کەئەبێ بەنیشانە بۆ نەصبە (ئەلف)ە کە ئەبێت بەنیشانە بۆ منصوبی لە اسمای خمسە دا وەکو «رأيتُ أباك وأخاك »(٢) باوکی تۆ و وەبرای تۆم بینی ، ئەلفی (اباك) وە (اخاك) لەحاڵەتی نصبەدان ..

---

(١) جاءنی ، فعل ماضی ، نون ، وقایە ، ی ، مفعول بە ، زیدان، تثنیة وفاعلە ، حاڵەتی ڕەفعەی بەئەلفە ، نونی وقایە ، فعلیماضی ((جاء)) کە (ی) مفعولەن لکاند پێوە داوای پیش خۆی کرد بەمەکسوری وەکو جای گران بوو لەسەر زمانی عەرەب وناپەت ناچار هاتین نونێك کە ببێ بەحیمایەی ئەو هەمزەیە کە مەکسووری نەکات پاکە.

(٢) رایت ، فعل و فاعل ، اباك ، مفعول بە ، واو ، حرف عطف ، اخاك ، مفعول بە ، اخ ولب مضاف ، ك ، مضاف الیە .

وأما الكسرةُ فتكونُ علامةً للنصب في جمع المؤنث السالم ؛ وأما الياءُ فتكونُ علامةً للنصب في التثنيةِ والجمع وأما حذفُ النون فيكونُ علامة للنصب في الأفعال الخمسةِ التي رفعها بثباتِ النون { وللخفض ثلاثُ علاماتٍ } : الكسرةُ ، الياءُ ، الفتحةُ ؛ فأما الكسرةُ فتكونُ علامةً للخفضِ في ثلاثةِ مواضع : في إسمِ المفرد المنصرفِ ، في إسم المفرد المنصرفِ ، وجمع المؤنث السالمِ ؛
................................................................(٧)

---

﴿وأماالكسرةُ فتكونُ علامةً للنصب في جمع المؤنث السالم﴾ سێهەم بەش لە بەشەکانی منصوبات کەسرەیە واتە(ژێرە)کە ئەبێت بەنیشانە بۆ حاڵەتی (نەصبە) لەجەمعی(مؤنث)دا وەکو ((خلق الله السمٰوات))(١)واتەخوا ئاسمانەکانی درووستکردوە،وشەی(سموات)حاڵەتی نصبەی بەکەسرەیە و (مفعول بە) یە . ﴿وأما الياءُ فتكونُ علامةً للنصب في التثنيةِ والجمع﴾(٢) چوارەم لەنیشانەکانی منصوبات(یاء)یەکەئەبێت بە نیشانە بۆ حاڵەتی نصبە لە (تثنیە) دا وەکو ((رایت مسلمَین))(٣) دوو پیاوی باوەڕدارم بینی ؛ و لەجمع دا وەکو ((رایتُ مُسلمِین))(٤) کۆمەڵی باوەڕدارم بینی کەواتە لەهەردوو حاڵەتی (مثنی ، جمع ) دا ( یا) بووە بەنیشانەی نەصبە .

﴿وأما حذفُ النونِ فيكونُ علامة للنصب في الأفعال الخمسةِ التي رفعها في الثباتِ النونِ﴾ پێنجەم بەش لەنیشانەکانی منصوبات(حزفی نوون)ە کەئەبێت بەنیشانە بۆ حاڵەتی نەصبەلە (افعالی خمسە)دا وەکو ((الزیدانِ لن یفعلا الخیر)) (٥) ، ئەو دوو زەیدە کاری چاکەیان نەکردووە، کەواتە حزفی نوون لەحاڵەتی نەصبەیە وە بوونی نوون لەحاڵەتی ڕەفعەیە . ﴿وللخفض ثلاثُ علاماتٍ﴾ وتمان بۆ بەشەکانی أعراب چوار بەش هەیە ، یەکەم و دووەم کە(رفع) و( نصب) بوون باس کران وەسێ هەم کە ((خفض)) ە واتە ژێرە یان جەڕە کەسێ نیشانەی هەیە بۆ ناسینی : ﴿الكسرةُ ، الياءُ ، الفتحةُ﴾ ئەم سێ حاڵەتە مەجرووراتیان پێ ئەناسرێتەوە.﴿فأما الكسرةُ فتكونُ علامةً للخفضِ في ثلاثةِ مواضع﴾ کەسرە واتە (ژێر ) ئەبێت بەنیشانە بۆمەجرووری لەسێ جێگادا :﴿ في إسمِ المفرد المنصرفِ﴾(٦) یەکەم لەناوێکی تاکدا کەوا منصرف بێت واتە (جەڕە وتەنوینی لێ منع نەکرێت) . وەکو (مررتُ بزیدٍ )

﴿وجمع المؤنث السالمِ﴾ دووەم لەجەمعی مؤنث دا کەسرە ئەبێ بەنیشانەی مجروری وەکو ((رایت مسلماتٍ)) کۆمەڵی ئافرەتی باوەڕدارم بینی

---

(١)خلق ، فعل ماضی ، الله ، فاعل مرفوع ، السماوات ، مفعول بە حاڵەتی نەصبەی بە کەسرەیە .

(٢) فەرق و جیاوازی لەنێوان (تثنیە)و (جمع )دا ، تثنیە ، میمەکەی مەفتوحە و نوونەکەی مەکسوورە بەڵام جمع : میمەکەی مکسورە و نوونەکەی مفتوحە ، کەواتە عەکس و پێچەوانەی یەکترن .

(٣) رایت ، فعل و فاعل ، مسلمین ، مفعول بە حاڵەتی نەصبەی تثنیە بە یایە .

(٤) رایت ، فعل و فاعل ، مسلمین، مفعول بە حاڵەتی نەصبەی جمع بە یایە .

(٥) الزیدان ، مبتدا حاڵەتی ڕەفعەی بە ئەلفە ، لن ، ئاداتی ناصبەیە ، یفعلا ، فعل مضارع بە حزفی نوونەکەی ، الف ، فاعل ئەگەڕێتەوە بۆ هەردوو زەید ، الخیر: مفعول بە .

(٦) منصرف ، ئەو ناوەیە کە جەڕەو تەنوینی لێ منع نەکرێ واتە بچێتە سەری وەکو(زید ، بکر، عمرو) .

وجمع التكسير المنصرفِ وأما الياءُ فيكونُ علامةً للخفضِ في ثلاثة مواضع : في الأسماء الخمسةِ ،وفي التثنية والجمعِ وأما الفتحةُ فتكونُ علامةً للخفضِ في الإسم الذى لاينصرف { وللجزمِ علامتان} : السكونُ والحذف ، فأما السكونُ فيكونُ علامةً للجزمِ في فعل المضارع الصحيح الآخر ، ........................................................(٨)

---

﴿وجمع التكسير المنصرفِ﴾ سێیەم لەجەمعی تكسير دا (كەسرە) دەبێت بەنیشانەی مجروور وەكو(( مررت برجالِ )) بەلای كۆمەڵێ پیاودا ڕۆیشتم ( رجال)جمعی تكسیرە لە(رجل ) وەرگیراوە حاڵەتی جەڕەی بەكەسرەیە .

﴿وأما الياءُ فيكونُ علامةً للخفضِ في ثلاثة مواضع﴾دووەم : (یایە) كەئەبێت بەنیشانە بۆ حاڵەتی جەڕە لەسێ جێگادا :

﴿في الأسماء الخمسةِ﴾ یەكەم لەئەسمانی خمسە دا (یا) ئەبێت بە حاڵەتی جەڕە وەكو (( مررت بأبی)) بەلای باوكم دا ڕۆیشتم .

﴿وفي التثنية﴾ وەلە تثنية دا (یا) ئەبێت بەنیشانە بۆ حاڵەتی جەڕە وەكو ((مررت بمسلمينِ)) ڕۆیشتم بەلای دوو باوەڕداردا

﴿والجمع﴾ وەهەروەها لەجمع دا (یا) ئەبێت بەنیشانە بۆ حاڵەتی جەڕە وەكو ((مررت بمسلمين)) ئەم سێ حاڵەتە هەرسێ كیان حاڵەتی جەڕڕەیان بە (یا) یە .

﴿وأما الفتحةُ فتكونُ علامةً للخفضِ في الإسم الذى لاينصرف﴾(١) سێیەم بەش لەوانەی كە ئەبن بەنیشانە بۆ جەڕە ((فەتحە )) یە واتە سەر كە ئەبێت بەنیشانە بۆ مەجروورى لەناوێكى وادا كە (غیری منصرف) بێت ، وەكو(( مررت بأحمدَ)) حاڵەتی جەڕڕەی غیرە منصرف بە(فەتح)ەیە .

{ وللجزمِ علامتان}

چوارەم بەش لەبەشەكانی اعراب (مجزوم)ە دوو نیشانە هەیە بۆ ناسینی ﴿السكونُ والحذف﴾ یەكەم ساكن بوون ، دووەم حەزفی حەرەكە یان نوون ؛ ﴿فأما السكونُ فيكونُ علامةً للجزمِ في فعل المضارع الصحيح الآخر﴾ سكون ئەبێت بەنیشانە بۆحاڵەتی (جەزم) لەفعلی(مضارع)ێكا تەواو بێت ئاخرەكەی واتە كۆتایی حەرفە مضارعە كە حەرفی تەواو بێت لەحەرفەكانی (علة)(٢) نەبێت وەكو (( ~~لن يضربْ~~ لم يضربْ)) كە مجزوم بووە بەسكوون

---

(١) وشەی (غیر منصرف) ، واتە ناوێ كەوا حاڵەتی جەڕە و تەنوینی لێ مەنع بكرێ واتە نەهێنتە سەرى وەكوو وشەی(أحمد) كەحاڵەتی جەڕەی هەر بەفەتحەیە وەكوو (مررت بأحمدَ)؛ وەهەروەها تەنوین ناهێنتە سەرى ، بەڵام لەدوو حاڵەتا (غیر منصرف) ئەبێت بە(منصرف) یەكەم كاتێ كە اضافە بكرێ وەكوو ((مررت بأحمدِكم)) (دال)ی وشەی احمد مجروور بووە بەهۆی إضافە كردنی بۆلای (كم)؛ دووەم كە ئەلف و لام بهێنتە سەرى وەكوو ((مررت بالاحمدِ)) بەهۆی ئەلف ولامەوە مەجروور بوە ، كەواتە بەم دوو حاڵەتە (غیر منصرف) ئەبێت بە( منصرف) .

(٢) حەرفی علە : سیانە ، ئەلف ، وەكوو(قرا) ، واو ، وەكوو(دلو) ، یا ، وەكوو (طوی).

وأما الحذف فيكونُ علامةً للجزمِ في فعل المضارع المعتل الآخر، وفي الأفعال الخمسةِ التي رفعها بثبات النون{فصل}المعرباتُ قسمانِ قسمٌ يعربُ بالحركات وقسمٌ يعربُ بالحروفِ فالذي يعربُ بالحركاتِ أربعةُ أنواعٍ:الإسم المفردِ، والجمع التكسيرِ،وجمع المؤنث السالم، والفعل المضارع الذي لم يتصل بآخره شيءٌ وكلها ترفعُ بالضمة وتنصبُ بالفتحةِ و تخفضُ بالكسرةِ وتجزمُ بالسكونِ وخرج عن ذلك ثلاثةُ أشياء :جمع المؤنث السالمِ ينصبُ بالكسرةِ والإسمُ لاينصرفُ يخفضُ بالفتحة ........................................(٩)

---

﴿ وأما الحذف فيكونُ علامةً للجزمِ في فعل المضارعِ المعتلِ الآخرِ﴾ (حذف) ئەبێ بەنیشانە بۆ حاڵەتی (مجزوم) لەفعلی مضارع ێك دا کەئاخرەکەی حەرفی (علة) بێت ، وەکو((لن يرمي)).

﴿وفي الأفعال الخمسةِ التي رفعها بثبات النونِ﴾وەهەروەها(حذف)ئەبێ بەنیشانە بۆحاڵەتی(جزم) لە ئەفعالیخمسە دا وەکو((لم يفعلا)) بەحەزفی نونەکەی، هەروەکو چۆن حاڵەتی ڕەفعەی بە(اثبات)نونە.

{فصل}

﴿المعرباتُ قسمانِ﴾ ئەم بەشە باس لە بەشەکانی (معرب) دەکات دوو بەشە

﴿قسمٌ يعربُ بالحركاتِ﴾ بەشێکی إعرابدار دەکرێ بە حەرەکە کە سەر و بۆر و ژێرە( ـَــــِـــــُ).

﴿وقسمٌ يعربُ بالحروفِ﴾ بەشەکەی دووەم اعرابدار دەکرێت بەحرووف کە(ئەلف و واو و یا) بە جیا مصنف (خ.ل) دەڵێت: ﴿فالذي يعربُ بالحركاتِ أربعةُ أنواعٍ﴾ ئەوەی کە إعرابدار دەکرێ بەحەرەکە چوار بەشە:﴿ الإسم المفردِ ﴾یەکەم لەناوێکی تاکدا وەکوو (( جاءني زيد)) ﴿ والجمع التكسيرِ﴾ دووەم لەجەمعی تکسیردا وەکوو (( جاءني رجالٌ )) ..

﴿وجمع المؤنث السالمِ﴾ سێیەم لەجەمعی مۆنثی سالم دا وەکوو ((خلق اللهُ السماواتِ )) ؛

﴿والفعل المضارع الذي لم يتصل بآخره شيءٌ﴾چوارەم لەفعلی مضارع ێکدا کە ئەلکابێت بەئاخریەوە هیچ شتێك وەکوو((يضربُ)) ئەم چوارە ﴿وكلها ترفعُ بالضمة وتنصبُ بالفتحةِ و تخفضُ بالكسرةِ وتجزمُ بالسكونِ﴾ لەم حاڵەتەدا هەموویان (مەرفوع) دەبن بە(ضمة) یان (منصوب) دەبن بە (فتحه) یان ( مجرور) دەبن بە (كسره) یان (مجزوم) دەبن بە (سكون ) .﴿وخرج عن ذلك ثلاثةُ أشياء﴾وەلەم حاڵەتەدا سێ جۆری تر دەردەچێ ﴿جمع المؤنث السالمِ﴾ یەکەم لەجەمعی مۆنث ی سالم دا وەکوو (( رئيت همداتٍ))﴿ينصبُ بالكسرةِ﴾ منصوب دەبێ بەکەسرە،خۆی ئەبوایە منصوب بوایەبەڵام جەمعی(مؤنث)حاڵەتینصبەی بەکەسرەیە. ﴿ والإسمُ لاينصرفُ يخفضُ بالفتحة ﴾ دووەم ناوێ کەغیرە منصرف بێت مجرور دەبێت بەفەتحە وەکوو (( مررت بأحمدَ )) ئەبوایە (مجرور) بوایە بە(كسر)ە ، بەڵام حاڵەتی جەڕەی (غیرە منصرف) بە فەتحەیە

والفعل المضارع المعتل الاخرِ يجزم بحذف آخره.والذى يعربُ بالحروفِ أربعةُ أنواع: التثنيةُ وجمع المذكر السالمِ وأسماء الخمسةِ والأفعال الخمسةِ وهي :يفعلانِ و تفعلانِ ويفعلونَ و تفعلون و تفعلينَ ، فأما التثنيةُ فترفعُ بالألفِ وتنصبُ وتخفضُ بالياء ، وأما الجمع المذكر السالم فيرفعُ بالألفِ وينصبُ ويخفضُ بالياء ؛وأما الأسماءُ الخمسةِ فيُرفعُ بالواوِ ويُنصبُ بالألفِ ويخفضُ بالياء ؛....(١٠)

---

﴿والفعل المضارع المعتل الاخرِ يجزم بحذف آخره﴾ سێیەم فعلی (مضارع)ێکە ئاخر حەرفی لەحروفی (علە) بێت کەمجزووم دەبێ بەحەزفی نوون واتە نوونە کە لادەبرێ وەکو ((یرمی)) بە حەزفی نوونەکەی . ﴿والذى يعربُ بالحروفِ أربعةُ أنواع ﴾ ئەوەی کە إعراب بە حرووفە چوار جۆرن ﴿التثنيةُ ﴾ یەکەم إعراب بەحرووف لە (تثنیة)دایە وەکوو((زیدان)) حاڵەتی ڕەفعەی بە ئەلفە؛ ﴿وجمع المذكر السالم﴾دووەم لەوانەی کە إعراب بەحرووفە(جمعی مذکری سالم)ە وەکوو ((مسلمون)) حاڵەتی ڕەفعەی بە واوە؛ ﴿وأسماء الخمسةِ﴾ سێیەم لەوانەی کە إعراب بەحرووفە (ئەسمائی خمسە)یە وەکوو (( اباك و اخاك)) ﴿والأفعال الخمسةِ﴾(١) ئەفعالی خمسە بریتین لەمانە ﴿يفعلانِ و تفعلانِ ويفعلونَ و تفعلون و تفعلينَ ﴾ ئەم پێنج فعلە حاڵەتی إعرابیان بەحرووفە.

﴿ فأما التثنيةُ فترفعُ بالألفِ وتنصبُ وتخفضُ بالياء﴾ تثنیة : مرفووع دەبێ بەئەلف وەکوو ((جاءنی زیدان)) ئەلف لەوشەی (زیدان) حاڵەتی ڕەفعەیە بووە بە فاعل بۆ (جاءنی) ؛ ومنصوب ومجروور دەبێت بە(یا) وەکوو ((رایت مسلمین)) و((مررت بمسلمین)) لەم دوو حاڵەتەدا إعراب بە حرووفن. ﴿وأما الجمع المذكر السالم فيرفعُ بالألفِ وينصبُ ويخفضُ بالياء ؛﴾ دووەم بەش لەوانەی کە إعراب بە حرووفن (جمعی مذکر سالم)ە مرفووع ئەبێ بەواو لەحاڵەتی رەفعەدا وەکوو ((جاءني مسلمون)) کۆمەڵێ پیاوی باوەڕدار هاتن بۆلام ( واو)ی (مسلمون) حاڵەتی ڕەفعەیە وەفاعلە بۆ جاء، وە (جمعی منکر) حاڵەتی نصبە و جەڕەی بە (یا)یە وەکوو ((رایت مُسلمِین)) ، ((مررت بمسلمن))کەواتە دەرکەوت حاڵەتی نصبەو جەڕەی (جمعی مذکر)بە (یا)یە.

﴿وأما الأسماءُ الخمسةِ فيُرفعُ بالواوِ ويُنصبُ بالألفِ ويخفضُ بالياء﴾سێیەم بەش لەوانەی کەإعرابیان بە حرووفە (اسمائی خمسەیە) مەرفووع دەبێ لەحاڵەتی ڕەفعەدا بە (واو) وەکوو ((جاءني ابوك)) ومنصوب دەبێ لەحاڵەتی نصبەدا بە(ئەلف) وەکوو ((رایت اباك)) ومجروور دەبێ لەحاڵەتی جەڕەدا بە (یا)یە وەکوو (( مررت بابیك)) کەواتە هەرسێ حاڵەتی ( اسمائی خمسە ) بەحرووفە .

---

(١) ئەم پێنج فعلە ناسراوون بە(افعال خمسە) ، یفعلان: بۆ دووپیاوی غائب. تفعلان: بۆ دوو ئافرەتی غائب لەگەڵ ئەوەشا بۆ دوو پیاوو دوو ئافرەتی حازر دێت ، یفعلون: بۆ کۆمەڵێ پیاوی غائب ، تفلون: بۆ کۆمەڵێ پیاوی حازر ، تفعلین: بۆ یەك ئافرەت کە حازر بێت.

وأما الأفعال الخمسةِ فيُرفعُ بالنونِ وتُنصبُ وتجزمُ بحذفها { بابُ الأفعال} الأفعالُ ثلاثةٌ : ماضي ،مضارع ، أمر؛ نحو ضربَ ، يضربُ إضرب ؛ فأما الماضي مفتوح الآخر ابداً ، والآمرُ مجزومٌ أبداً ، والمضارعُ ماكانَ في أولِهِ إحدى الزوائدِ الأربع يجمعُها قولُك : أنيتُ ، وهوَمرفوعٌ أبداً حتى يدخلُ عليه ناصبٌ أو جازمٌ؛ (فالنواصبُ عشرةٌ) وهي : أنْ ، لَنْ ، إذن ، كي،لامَ كي ، لام الجحود، حتى ، الجواب بالفاء والواو و أو؛.........................(١١)

---

﴿وأما الأفعال الخمسةِ فيُرفعُ بالنونِ وتُنصبُ وتجزمُ بحذفها﴾چوارەم بەش لەوانەی کە إعراب بەحرووفن (افعالی خمسە) یە مرفووع دەبێ لەحاڵەتی ڕەفعەدا بە(نوون) وەکوو ((یضربانِ)) ، ومنصوب مجزووم دەبێ بەحەزفی نوونەکەی وەکوو ((یضربا)) .

## { بابُ الأفعال}

ئەم (باب) باس لەفعلەکان دەکات﴿الأفعالُ ثلاثةٌ﴾ فعلەکان سێ جۆرن: ﴿ماضي ،مضارع ، أمر؛ نحو ضربَ ، يضربُ إضرب﴾یەکەم فعلی (ماضی)یە وەکوو(( ضرب)) واتە لێی دا ، دووەم فعلی (مضارع)ە وەکوو ((یضربُ ))واتە لێی ئەدا ، سێیەم فعلی (امر)ە وەکوو ((إضرب)) لێی بدە.

﴿فأما الماضي مفتوح الآخر ابداً﴾(١) فعلی ماضی آخر حەرفی بەهەمیشەیی مەفتووحە و سەری هەیە وەکوو((ضربَ، فتحَ ، نصرَ ، قتلَ))

﴿والآمرُ مجزومٌ أبداً﴾(٢) امر مجزوومە بەهەمیشەیی وەکوو ((إضربْ ، اکتبْ))

﴿والمضارعُ ماكانَ في أولِهِ إحدى الزوائدِ الأربع يجمعُها قولُك﴾ فعلیمضارع(٣) ئەوەیە کەلەسەرەتای وشەکەوەبێ یەکێ لەو حەرفە زیادانەی کەکۆکراوەتەوە لە وشەی﴿أنيتُ﴾

﴿وهوَمرفوعٌ أبداً﴾ فعلی مضارع بەهەمیشەیی مرفوعە و بۆری هەیە

﴿حتى يدخلُ عليه ناصبٌ أو جازمٌ؛﴾ وتمان فعلی مضارع مەرفووعە هەتاوەکوو نەچێتە سەری ئاداتی (ناصبە و جازمە ) ئەوکاتە لەمەرفوعی یەوە ئەیگۆڕن بەمەنصوب و مەجزووم.

﴿ فالنواصبُ عشرةٌ﴾ئاداتی ناصبە کەفعلی مضارع منصوب دەکەن دە حەرفن ؛

﴿وهي﴾ئاداتەکانی ناصبە ئەمانەن ﴿أنْ ، لَنْ ، إذن ، كي،لامَ كي ، لام الجحود، حتى ، الجواب بالفاء والواو و أو﴾ بۆ نموونەی هەندێکیان ئەڵێین :

ان:((احبُ ان اطیع اللهَ تعالی))(١) واتە طاعەت وعیبادەتیخوای باڵابەدەستم پێ خۆشە.

---

(١) فعل ماضي ، واتە فەرمانی ڕابردوو ، کارێکە لەکاتی ڕابردوودا ئەنجام درابێت وەکوو((کتبَ)) واتە نووسی .

(٢) فعل امر ، واتە فەرمانی داخوازی ، کەداوای لێدەکات ئێستا کارێ ئەنجام بدات وەکوو(اضرب) واتەلێبدە .

(٣) فعل مضارع ، واتە فەرمانی داهاتوو، یان کارێکە ئێستا ڕوودەدات وەکوو ((یدرس)). واتە دەخوێنێ .

(١) احبُ: فعل ماضی ، فاعلی تیا شاراوەتەوە بە ((انا)) ، ان ، ئادات ناصبە ، اطیع ، فعل مضارع منصوب بە ((ان)) ، فاعیلی تێدا شاراوەتەوە بە ((انا)) ،

(والجوازمُ ثمانيةُ عشرَ )وهي : لم ، لَمّا ، ألم ، الما ، لام الأمرِ و الدعاءِ ، لا في النهي والدعاءِ، إنْ ، ما ، مَن ، ............................................................(١٢)

---

لن : ((لن يغفرَاللهُ تعالى للكافرين)) (١) واتە خوای بالآبەدەست لە کافرەکان خۆش نابێت.

کی: (( احبُ طول العمرِ کی أحصلَ العلم))(٢) پێم خۆشە تەمەندرێژبم تاوەکو علمی زۆربەدەست بێنم.

﴿والجوازمُ ثمانيةُ عشرَ﴾ ئاداتی جازمە کە ئەچنە سەر فعلی مضارع و مجزوومی دەکەن هەژدە پیتن کەئەمانەن : ﴿ لم ، لَمّا ، ألم ، الما ، لام الأمرِ و الدعاءِ ، لا في النهي والدعاءِ ، إنْ ، ما ، مَن ، مهما ، إذما ، أيٌّ ، متى ، أيّانَ ، اينَ ، أنّى ، حيثُما ، كيفما ، وإذا في الشعر خاصةً .﴾ نموونە بۆیان ئەڵێین :لم: ((لم يلد ولم يولد))(٣) واتە ئەکەسی لێ نەبووە ونە لەکەسیش بووە .

لما: ((لماينفعْ عمری))(٤) واتە تەمەنی من سوودی نەبوو.

ألم : ((الم نشرح ))(٥) واتە شقمان نەکرد سینگت.

لا : ((لاتذنب))(٦) واتە گوناه مەکە .

إن : (( إن تتب يغفرْ ذنبك))(٧) واتە ئەگەر تۆبەبکەیت خوا لەگوناهت خۆش دەبێ .

ما : (( ماتصنع اصنع )) (٨) واتە چی بکەی ئەیکەم .

من: ((من يعمل عملاً صالحا يكن ناجياً))(٩) واتە هەرکەسێ کردەوەی چاك بکات سەرفراز دەبێ.

---

...محلا منصوب مفعول به بۆ ((احب))، الله: مفعول به بۆ ((اطع)) ، تعالى: حال بۆ الله .

(١) لن: ئادات ناصبة ، يغفر: فعل مضارع منصوب به ((لن ))، الله: فاعل مرفوع ، تعالى ، حال ، للكافرين : جارو مجرور ، تعلق به ((يغفر)) ئەبەستێت .

(٢) احبُ ، فعل مضارع بۆ (متكلم وحده) فاعلی تێدا شاراوەتەوە بە (انا) ، طول ، مفعول به مضاف ، العمری : مضاف اليه ، کی :ئادات ناصبة ، احصل: فعل مضارع بۆ (متكلم وحده) فاعلی تیا شاراوەتەوە بە (انا) العلم: مفعول به .

(٣) لم : ئادات جازمە ، يلد ، فعل مضارع ، فاعلی تێدا شاراوەتەوە بە (هو) ئەگەڕێتەوە بۆ الله ، و ، حرف عطف، لم : ئاداتی جازمە ، يولد: فعلی بنامفعولی مضارعە ، نائب فاعلەکەی تیا شاراوەتەوە بە (هو) ئەگەڕێتەوە بۆ (الله).

(٤) لما ، ئادات جازمە ، ينفع ، فعل مضارع مجزووم بە(لما) ، عمر، لەتقديرا فاعل مرفوع مضاف ، ی ، مضاف اليه .

(٦) لا : ناهيە جازمە، تذنب، فعل مضارعە فعلی تیا شاراوەتەوە بە (انت ).

(٥) الم ، ئاداتی جازمەیە ، نشرح: فعل مضارع مجزوم بە الم ، وفاعلی تیا شاراوەیە بە (نحن) .

(٧) ان ، حرفی شرطە ، تبت: فعل مضارع فاعيلی تيادا شاراوەتەوە بە (انت) ، ليغفر، فعلی مضارعە بێنا مفعولجواب شرطە واتە وەڵامی مەرجەکەیە بەمەرجێ حتۆ خۆش دەبێت ئەوە بکەیت ، ذنوب: نائب فاعلە ، ك ، مظاف اليه يە .

(٨) ما: جازمە ، تصنع: فعل مضارع مجزووم بووە بە (ما) وە فاعلی تیا شاراوەتەوە بە انت ، اصنع: فعل مضارع فاعيلی تيا شاراوەتەوە بە انا .

(٩) من ، ناوی شرطە لە محلا مبتدأ ، يعمل : فعل مضارعە فاعيلی تيا شاراوەتەوە بە هو ئەگەڕێتەوە بۆ من ، يعمل: فعلی شرطە ، عملا: مفعول به وەهەندێ حتێن مفعول مطلقە ، صالحا ، صفەیە بۆ عملا. يكن : فعل مضارع ناقصە وە جەزای شەرطە کەیە اسمی يكن ضەمیرێکی شاراوەیە کە(هو) یە ئەگەڕێتەوە بۆ من، ناجيا: خەبەری يكن ، ئەم ڕستەیەی شرط و جەزایە لە محلا خەبەرە بۆ (من) کەوتمان مبتدایە .

مهما ، إذما ، أيُّ ، متى ، أيّانَ ، أينَ ، أنّى ، حيثُما ، كيفما ، وإذا في الشعر خاصةً .
{بابُ مرفوعاتِ الأسماء} المرفوعاتُ سبعةٌ ، وهيَ : الفاعل والمفعولُ الذي لم يُسمّ فاعلهُ ، والمبتدأو خبرهُ و اسمُ كانَ وأخواتها ، وخبر إن وأخواتها ، والتابعُ للمرفوع ،..................(١٣)

مهما : ((مهما تفعل تسئل منه))(١) واته هەرشتێ بکەیت مەسئولی لێ ی .

إذما : ((أذما تتب تقبل توبتك)) واته هەرکاتێ تەوبە بکەیت قبول دەکرێت .

ايّ : (( اي عالم يتكبر يُبغضهُ الله تعالى)) (٢) واته هەر عالمێ خۆی بەگەورە بزانێ خوای تعالا رقی لێ هەڵدەگرێ .

متى: ((متى تحسد تهلك)) (٣) واته هەرکاتێ حەسودی بەری لەناو دەچی .

اين : (( اين تكن يدرك الموت)) (٤) واته لەهەرکوێ بی مردن پێت دەگات .

أنى : ((أنى تذنب يعلمكَ الله)) (٥) واته لەهەرکوێ تاوان و گوناه بکەی خوا پێت دەزانێت .

اذاما: ((اذاما تعمل بعملك تكن خير الناس)) (٦) واته هەرکاتێ بە عەمەلی خۆت کردەوە بکەیت چاکترین کەس دەبیت. (لم ، لما ، لام الامر، لا لەنەهی کردن) ، ئەم چوارە یەك فعلی مضارع مجزوم دەکەن وەیانزەکەی تر دوو فعلی مضارع مجزوم دەکەن.

## {بابُ مرفوعاتِ الأسماء}

ئەم (باب)ە باسی ئەو ناوانە دەکات کە مەرفوعن ﴿المرفوعاتُ سبعةٌ ﴾ مرفوعات حەوت جۆرن ﴿الفاعل والمفعولُ الذي لم يُسمّ فاعلهُ﴾ یەکەم فاعیل مەرفوعە دووەم مفعولێ کە ناوی فاعیل نەبرابێ ﴿ والمبتدأو خبرهُ﴾ سێیەم وچوارەم نیهاد و کوزارە مرفوعن .﴿و اسمُ كانَ وأخواتها ﴾ پێنجەم اسمی (کان) وهاوڕێیەکانی مرفوعن ﴿وخبر إن وأخواتها﴾ شەشەم خەبەرێ ( ان) و هاوڕێکانی مرفوعن ﴿والتابعُ للمرفوع﴾ حەوتەم شوێن کەوتوانی مرفوع..

(١)مهما : ناوی شرطه مفعول به بەو پێش کەوتووە ، تفعل ، فعلمضارع فاعلی تیاشاراوەتەوە بە انت وفعلی شرطه ، تسئل ، فعلی مضارع ی نادیارە نائب فاعیلی انت یە وجەزای شرط ئەگەیەنێ ، منه ، جارو مجرورە تەعلوف بە تسئل ئەبەستێ مفعول بەی غیرە صریحە بۆ تسئل .

(٢) ای ، ناوی شرط و مبتدایە لەمحلا ، عالم. مضاف الیه ، یتکبر: فعل مضارعه وفیعلی شرط و فاعیلی تیا شاراوەتەوە بە (هو) ئەگەڕێتەوە بۆ عالم یبغض:فعلی مضارعه و جەزای شرط ، هـ : مفعول به ، الله ، فاعیل .

(٣) متی ، ناوی شرطه لەمحلا منصوب مفعول به بۆ فیعلی شرط ، تحسد: فعل مضارع و فعلی شرطه فاعیلی تیا شاراوەتەوە بە انت ، تهلك ، فیعلی مضارعه جەزای شرطه فاعیلی تیا شاراوەتەوە بە ( انت) .

(٤) این ، ناوی شرطه مفعوله بۆ فیعلی شرط ، تكن، فعلی مضارعه و فعلی شرطه فاعیلی تیا شاراوەیە بە( انت )، یدرك : فعلی مضارعه جەزای شرطة. كـ:مفعول به ، الموت : فاعیل .

(٥) انی ، ناوی شرطه لەمحلا منصوب مفعول به بۆ فعلی شرط ، تذنب : فعلی مضارعه وفعلی شرطه وفاعلی تیا شاراوەتەوە به ( انت) ، یعلم ، فعلی مضارعه و جزای شرطه ، ك : مفعول به ، الله : فاعل مرفوع .

(٦) اذاما ، ناوی شرطة لەمحلا منصوب مفعول به بۆ فعلی شرط ، تعمل: فعلی مضارعه وفعلی شرطه وفاعلی تیا شاراوەتەوە به ( انت)، بعملك ، جارو مجرور (تعلق ) به (تعمل) دەبەستێ ، ك: مضاف الیه ، تکن ، فعل مضارع ناقص وە جزای شرطه وفاعلی تیا شاراوەتەوە به ( انت)، فاعلەکە ئیسمی (تکن)ە ،خیر، خەبەرە بۆ (تكن) ، الناس : مضاف الیه .

وهو أربعة أشياء : النّعتُ، والعطفُ، والتوكيدُ ، والبدلُ.{ بابُ الفاعلِ } الفاعلُ : هوَ الاِسمُ المرفوعُ المذكورُ قبلهُ فعلهُ ، وهو على قسمَين: ظاهرٍ ، ومضمرٍ؛ فالظاهرُ نحو قولكَ : قامَ زيدٌ ، ويَقومُ زيدٌ ،وَقامَ الزيدانِ ،وَقامَ الزيدونَ ، ويقومُ الزيدونَ ، وقامَ الرجالُ ، ..............................(١٤)

---

﴿وهو أربعة أشياء:﴾ كە چوارن ﴿النّعتُ﴾ صيفەتە﴿والعطفُ﴾ قسميەكە عەطفی كەيتە سەر پێشوو ﴿والتوكيدُ﴾ تاكيد كردنی وتەيەكە ﴿والبدلُ﴾ لەجياتی يان جێگری ئەو شتە. جاوەكو مصف هەريەكەيان لە بەشی تايبەتا باس دەكات

{ بابُ الفاعلِ }

ئەم (باب)ە باس لە فاعيل دەكات ﴿الفاعلِ:﴾ پێناسەی فاعيل ﴿هوَالاِسمُ المرفوعُ المذكورُ قبلهُ فعلهُ ﴾ ئەو ناوەيە كە مەرفوع بێت و فعلەكەی لە پێشەوە باس كرا بێت ، وەكو ((قام زيد)) قام فعل ماضی ، زيد : فاعيل ئەوەتا لەپێش فاعيل فيعلەكەی هەيە . ﴿وهوَ﴾ ئەم فاعيلە ﴿على قسمَينِ﴾ لەسەر دوو بەشە ﴿ظاهرٍ ومضمرٍ﴾ يەكەم ظاهر وەكو زيد لە نموونەی سەرەوە ، دووەم ضميرە وەكو((ضربت زيداً)) دام لەزەيد ( ت): ضميری لكاوی فاعيلە .

﴿ ظاهرٍ ، ومضمرٍ؛ فالظاهرُ نحو قولكَ : قامَ زيدٌ﴾ جۆری يەكەم : فاعيلی ئاشكرا : وەكوو ((قام زيد)) هەستا زەيد ، وشەی زەيد فاعيلە و مرفوعە بە قام نموونە بوو بۆ فعلی ماضی ،﴿ وَيقومُ زيدٌ﴾ هەڵئەسێ زەيد بۆ فيعلی مضارعە كە زەيدی مرفووع كردوە و كردوويە بە فاعيلی خۆی ، ﴿وَقامَ الزيدانِ﴾ هەڵئەسێ دوو زەيد وشەی زيدان تثنيە بۆ دوو زەيد حاڵەتی ڕەفعەی بە ئەلفە وەبووە بە فاعيل بۆ فيعلی مضارع كە يقوم ،﴿ وَقامَ الزيدونَ﴾ هەڵسا كۆمەڵێ زەيد وشەی زيدون بۆ جەمعە و كۆيە حاڵەتی ڕەفعەی بە (واو) ە بووە بە فاعيل بۆ (ماضی) كە قام ، ﴿ويقومُ الزيدونَ﴾ كۆمەڵێ زەيد هەڵئەسێ بۆ (جەمع)ە حاڵەتی ڕەفعەی بە (واو)ە بووە بە فاعيل بۆ فيعلی مضارع كە يقوم

﴿وقامَ الرجالُ﴾ وشەی رجال (جمعە تكسيرە) حاڵەتی ڕەفعەی بە ئەلفە بووە بە فاعيلی قام .

---

(١)كان و هاوڕێكانی پێویستیان بە اسم و خەبەر هەیە اسمەكەیان لە مەرفوعاتە و مەرفووعن وەكو ، كان زيد فقيرا وشەی زەيد اسمی (كان )يە.

(٢) إن و هاوڕێیەكانی بە پێچەوانەی كان و هاوڕێیەكانی ئەم خەبەر مرفوع دەكەن و إسم منصوب دەكەن خەبەرەكەی لە مرفوعاتە وەكو: إن زيدا قائم ، وشەی قائم : خەبەرە و مەرفوعە .

ويقومُ الرجالُ ،وقامتْ هندٌ ، وتقوم هندٌ ، وقامتِ الهندانِ ، وتقومُ الهندانِ ، وقامتِ الهنداتُ ، وتقومُ الهندات، وقامتِ الهنودُ ، وتقومُ الهنودُ ، وقامَ أخوكَ ، ويقومُ أخوكَ ، وقام غُلامي، ويقومُ غلامي، وما أشبهَ ذلكَ ،والمضمرُ اثناعشرَ، نحو قولكَ : ضربتُ ، وضربنا ، وضربتَ ،وضربتِ ، وضربتُما ، وضربتم ، وضربتُنَّ وضربَ ، وضربتْ ،..............................(١٥)

---

﴿ويقومُ الرجالُ﴾ هەروەها رجال بووە بەفاعیل بۆ یقوم کە مضارعە . ئەمانەی کەباس کران بۆ منکر بوون ، ﴿وقامتْ هندٌ﴾ هەستا هند وشەی هند بووە بەفاعیل بۆ قام ، ﴿وتقوم هندٌ﴾ بۆ فیعلی مضارع کە فاعیلی هەیە ﴿وقامتِ الهندانِ ، وتقومُ الهندانِ﴾ ئەم دوو نمونە بۆ فاعیل کە (تثنیە) بێت حاڵەتی ڕەفعەیان بە ئەلفە ﴿وقامتِ الهنداتُ ، وتقومُ الهنداتُ﴾ ئەم دوو نمونە بۆ (جەمعی تکسیری مؤنثە) کە حاڵەتی رەفعەیان بە ئەلفە بوون بە فاعیل بۆ فعلی ماضی و مضارع ، ﴿وقامتِ الهنودُ ، وتقومُ الهنودُ﴾ ئەم دوو نمونە بۆ (جەمعی مؤنثە) کە بوون بەفاعیل حاڵەتی رەفعەیار بە واوە وە یەکێکیان بۆ ماضی ودوەم بۆ مضارع . ئەمانەش کەباس کران بۆ مؤنث بوون.

﴿وقامَ أخوكَ ، ويقومُ أخوكَ﴾ ئەم دوو نمونەش بۆ (اسماء خمسە) یە کە بوون بەفاعیل حاڵەتی ڕەفعەیان بە (واو)ە یەکەم بۆ ماضی و دووەم بۆ مضارع ﴿وقام غُلامي، ويقومُ غلامي﴾ ئەم دوو نمونەش بۆ (إضافە )کردنی فاعیلە . بەڵێ ئەم نمونانەی سەرەوە کەباس کران نمونە بوون بۆ فاعیلی ئاشکرا کە هەموویان بە ئاشکرا دیار بوون ، وەهاتە سەر ئەوانەی کە (ضمیر) ئەبێ بە فاعیل .

﴿والمضمرُ اثناعشرَ﴾ جۆری دووەم فاعیلی~~نادیار و شاراوە (ضمیرە کەبە بەفیعلەوە لکاوە)~~ کە دوانزدەن : ﴿نحو قولكَ﴾ وەکوو تۆ بڵێ ﴿ضربتُ﴾لێم دا بۆ متکلم ﴿ضربنا ﴾ بۆ (متکلم مع الغیر)ە ﴿ضربتَ﴾ بۆ پیاوێ کە لێی بدا ﴿وضربتِ﴾بۆ ئافرەتێ کە لێی بدا ﴿وضربتُما﴾(١) ئەم وشە بۆ دوو پیاوە و دوو ئافرەت بەکاردێ واتە تثنیەی (مذکر و مؤنث ).

﴿وضربتم﴾ بۆ کۆمەڵێ پیاو ﴿وضربتُنَّ﴾ بۆ کۆمەڵی ئافرەت ئەم نمونانە کەهێنرانەوە بۆ حازری بوون ..

﴿وضربَ﴾بۆ یەك پیاو ﴿وضربتْ﴾ بۆ یەك ئافرەت

---

(١) وشەی ضربتما بۆ مؤنث و مذکری حازر هاتووە .

وضربَا ، وضربوا، وضربْنَ { بابُ المفعولِ الذي لَمْ يسمَّ فاعَله} وهو الإسمُ المرفوعُ الذي لم يذكر معهُ فاعلهُ ، فإن كان الفعل ماضياً ضم أولهُ وكسرَ ماقبل آخرهِ، وإن كان مضارعاً ضم أوله وفتح ماقبلِ آخرهِ ، وهو على قسمينِ : ظاهرٍ ومضمرٍ ؛ فالظاهرُ نحو قولكَ:ضربَ زيدٌ ، ويضربُ زيدٌ ، واكرمَ عمرٌو ، ويكرمُ عمرٌو ؛

(١٦)................................................................

﴿وضربَا﴾ (١) بۆ دوو پیاو و دوو ئافرەت ﴿وضربوا﴾ بۆ کۆمەڵێ پیاو ﴿وضربْنَ﴾ بۆ کۆمەڵێ ئافرەت ئەم پێنج نمونەش بۆ غائیبی واتە حازر نەبێ غائب بن.

کەواتە ئەم دوانزە ضمیرە ئەبن بە فاعیل کە بریتین لە ﴿ ت ، نا ، ت ، تِ ، تما ، تم ، تنَّ ﴾ کەئەمانە بۆ حازر بەکاردێن ﴿ ت ، الف ، واو ، ن ﴾ بۆ غائیبن . ئەمانە ئەلکێن بە فیعلەوە و خۆیان ئەبن بە فاعیل . باسی فاعیل تەواو بوو ..

## { بابُ المفعولِ الذي لَمْ يسمَّ فاعَله}

ئەم (باب)ە باس لەفعلی بنا مجهول (٢) دەکات کە دووەم بەشە لە مرفوعات کە فاعیلەکەی ئاشکرا نیە . ﴿وهو الإسمُ المرفوعُ الذي لم يذكر معهُ فاعلهُ﴾ ئەو ناوە مەرفوعەیە کە فاعیلەکەی باس نەکرابێ لەگەڵ فیعلا ﴿فإن كان الفعل ماضياً ضم أولهُ وكسرَ ماقبل آخرهِ﴾ ئەگەر هاتوو ئەو فیعلە ماضی بوو ئەوە یەکەم حەرفی مضمومە وە پێش حەرفی ئاخیری مکسورە وەکو : (ضُرِب)، (ضا)مضمومە و (راء) مکسورە ئەمە لەفعلی (ماضی) یدا ﴿وإن كان مضارعاً ضم أوله وفتح ماقبل آخرهِ﴾ وەئەگەر هاتوو مضارع بوو ئەو فیعلە یەکەم حرفی مضموم ئەبێ و پێش حەرفی ئەخیری مفتوح دەبێت وەکو (يُضرَبُ)

﴿وهو على قسمينِ﴾ واتە ئەم دوو فیعلە مجهولە لەسەر دوو بەشە ﴿ظاهرٍ ومضمرٍ﴾ یەکەم فاعیلی ئاشکرایە وە دووەم فاعیل بە ضمیرە ﴿ فالظاهرُ نحو قولكَ﴾ ئەوەی کەئاشکرا بێت وەکوو دەڵێی ﴿ضُرِبَ زيدٌ﴾(٣) درا لە زەید بۆ ماضی ﴿ويُضرَبُ زيدٌ﴾(٤)بۆ فیعلی مضارع : لە ثلاثی مزید فیە ﴿واُكرِمَ عمرٌو﴾(٥)ڕێز گیرا لە عەمر بۆ ماضی ثلاثی مزید فیە.

﴿ويُكرَمُ عمرٌو﴾ ڕێز ئەگیرێ لە عەمر بۆ مضارعی ثلاثی مزید فیە.

---

(١) وشەی ضربا بۆ مؤنث و مذکر هاتووە بۆ حازری

(٢) فیعل دوو بەشە مجهول واتە فاعیل ئاشکرا نەبێت دووەم معلوم واتە فاعیل ئاشکرا بێت .

(٣) ضُرِب: فعل ماضی مجهول ، زيدٌ : نائب فاعیل مرفوع .

(٤) يُضرب : فعلی مضارعی مجهول ، زيدٌ : نائب فاعیل .(٥) اُكرِم : فعل ماضی مجهول ، عمرٌو : نائب فاعل مرفوع .

والمضمرُ اثناعشرَ ، نحو قولكَ : ضربتُ ، وَضَربنا ، وضربتَ ، وضربتِ ، وضربتما ، وضُربتُمْ ، وضربتُنَّ ، وضُربَ ، وضُرِبَتْ ، وضربَا ، وَضربوا، وضربنَ. { باب المبتدأ والخبرِ} المبتدأ: هو الاسم المرفوعُ العارى عن العواملِ اللفظيةِ. والخبر: هو الإسم المرفوعُ المسندُ اليه، نحو قولكَ: زَيد قائمٌ ، والزيدانِ قائمانِ، والزيدُونَ قائمونَ . والمبتدأ قسمانِ : ظاهرٌ ، ومضمرٌ ، فالظاهرُ ماتقدمَ ذكرهُ ؛ والمضمر اُثناعشرَ ، وهيَ: أنا ، ونحنُ ، وانتَ ، وأنتِ ، وأنتما، وانتمْ ،وانتنَّ ،

(١٧)..............................................

﴿والمضمرُ الناعشرِ﴾ ~~ئەوەی کەبە ضمیرە دوانزە دانەن~~ ﴿نحو﴾ وەکوو ﴿ضربتُ ، وَضربنا﴾ (١) بۆ متکلمی وەحدە و بۆ متکلم مع الغیر ﴿وضربتَ﴾ بۆ پیاوێ کە حازر بێ ﴿وضربتِ﴾ بۆ ئافرەتێ کەحازر بێ ، ﴿وضربتما﴾ بۆ هەردوو تثنیە ی (مؤنث و مذکر) واتە بۆ دووپیاو و دوو ئافرەت ، ﴿وضُربتُمْ﴾ بۆ کۆمەڵێ پیاوی حازر ﴿وضربتُنَّ﴾بۆ کۆمەڵێ ئافرەت کە حازر بن . ﴿وضُربَ﴾بۆ پیاوێ کە حازر نەبێ ﴿وضُرِبَتْ﴾بۆ ئافرەتێ کەحازر نەبێ ، ﴿وضربَا﴾بۆ هەردوو تثنیە ی (مذکر و مؤنث) کە غائب بن ، ﴿وَضربوا﴾ بۆ کۆمەڵێ پیاوی غائب ﴿وضربنَ﴾بۆ کۆمەڵێ ئافرەتی غائب . ئەمانە فعلی بنا مەجهولن نائب فاعلیان (ضمیر)ە لکاوە بە فیعلەوە وەك باس کران .

~~باسی بنا مفعول کە فاعیلی ناوو نەبرابێ ، نائب فاعیلی هەیە واتە جێگیری فاعیلی هەیە~~ .

{ باب المبتدأ والخبرِ}

ئەم (باب)ە باسی لەمبتدا و خبر ئەکات کە هەردووکیان لە مەرفوعاتن .

﴿المبتدأ: هو الاسم المرفوعُ العارى عن العواملِ اللفظيةِ﴾مبتدا : ئەو ناوە مرفوعەیە کە رووتە لە عواملی لەفظی ﴿والخبر: هو الإسم المرفوعُ المسندُ اليه﴾خەبەر : ئەو ناوە مەرفوعەیە کە بدرێتە پاڵ مبتدا وەکو ﴿نحو قولكَ﴾ وەکوو وتەی تۆ ﴿زَيد قائمٌ ﴾ (٢) زەید وەستاوە ﴿والزيدانِ قائمانِ﴾ (٣) دوو زەید وەستاون ، ﴿والزيدُونَ قائمونَ﴾ (٤) کۆمەڵێ زەید ڕاوەستاون . ﴿والمبتدأ قسمانِ﴾ مبتدا دوو بەشە ﴿ظاهرٌ ، ومضمرٌ﴾ هەمانە ناوێکی ئاشکرایە هەمانە بە ضمیرە ﴿فالظاهرُ ماتقدمَ ذكرهُ﴾ ئەو مبتدایەیی کە ئاشکرابێت باس کرا لە سەرەوە .

﴿والمضمر اُثناعشرَ﴾ ئەوەی کەبە ضمیر دەبێتە مبتدا دوانزە دانەن ﴿وهيَ: أنا﴾ واتە من ﴿ونحنُ﴾ ئێمە ﴿وأنتَ﴾بۆ پیاوێ کەحازر بێت ﴿وأنتِ﴾ بۆ ئافرەتێ کە حازر بێت ﴿وأنتما﴾ بۆ دوو پیاو دوو ئافرەت هاتووە ﴿وأنتمْ﴾ بۆ کۆمەڵێ پیاوی حازر ﴿وأنتنَّ﴾بۆ کۆمەڵێ ئافرەتی حازر..

(١)ضُرِبَ ، فعل ماضی مبنی للمجهول، ت ، ضمیر لکاو نائب فاعل .

(٢) زید ، مبتدا مرفوع ، قائم ، خبر مرفوع (٣) الزیدان ، بۆ تثنیە مبتدا مرفوع ، الف : حالەتی رەفعیەتی ، قائمان ،خبرە بۆ زەیدان .

(٤) الزیدون، بۆ جەمعە مبتدایە ، و ،حالەتی رەفعیەتی ، قائمون ، خبرە بۆ زەیدون .

